وتەی سەرنوسەر

# گۆڤاری هونەری نوێ بۆ؟

هەموو ئاگاداری مێژووی رۆژنامەگەری کوردین، کە یەکەم رۆژنامەی کوردی چۆن و کەی و لە کوێ دەرچوو؟ لە وانەیە هەرگیز رۆشنبیری کورد لەو سەردەمەدا بیری بۆ ئەوە نەچوبێت کە پاش (٩٠-١٠٠) سالی پاشتر ئەوەندە رۆژنامەو گۆڤار و بلاوکراوە و کتێب دەرچێت لە کوردستاندا، خۆ ئەگەر سەرنووسەری رۆژنامەی کوردستان خوالێخۆشبوو ( مقداد مدحت بەدرخان) بیزانیبا داهاتووی رۆژنامە گەری کوردی ئەوەندە گەش و رووناك دەبێت ئەوەندە نیگەران و نارەحەت نەدەبوو کە نەیارانی کورد نەیان دەهێلا رۆژنامەکە لە کوردستان دەرچێت ، چونکە باش لە رۆلی رۆشنبیری گەیشتبوون کە ئەگەر خەلکی کوردستان زیاتر چاو بکاتەوە، هەرگیز قبولی ئەو ژێر دەستیە و دابەشکردنە نارەوایەیی کوردستان ناکات، بۆیە هەردەم رێگری لە کورد کراوە کە بە زمانی دایکی خۆی بدوێت و بنووسێت دەرئەنجامیش دوژمنان هەر نا ئومێدیان پێ براوە خۆشبەختانە پاش راپەرینی (١٩٩١) ی باشووری کوردستان رۆژنامە گەری کوردی رۆژ بە رۆژ پەرەسەندنی بەردەوامی بەخۆوە بینیوە تا ئەمرۆ و ئەم ئەندازەیە هاتووە، گەرچی لێرەو لەوێ گلەیی و گازاندەی زۆر دەکرێت لە سەر زۆری رۆژنامەو گۆڤارەکان و کەمی خوێنەران کەمن لەوانەیە خۆم کەسێك بم لەوانە زۆر نیگەران بوویم لەسەر ئەم گەشە سەندنە ناسروشتی یەی رۆژنامەگەری کوردی لە رووی چەندێتیەوە، بەلام لەگەل ئەوەشدا هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەو رێگرتنەی لە



رابووردودا لە رۆژنامەگەری کوردی کراوە لەلایەن نەیارانی نەتەوەکەمانەوە بەلام ئەمرۆ ئازادی لە رۆژنامەگەری کوردیدا بەتایبەت لە باشووری کوردستان تا ردەیەکی باش بوونی هەیەو کەش و هەوایەکی وای درووست کردووە کە زۆرێك لە رۆژنامە نووسان پەنا ببەنە بەر دەرکردنی رۆژنامەیەك یان گۆڤارێك زۆر جاریش ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری یەوە هاوکاری د ارایی دەکرێن، بەلام گۆڤارو رۆژنامە ئەهلییەکان زیاتر پشت بە خۆیان دەبەستن بۆ دەرکردنی گۆڤارەکانیان، ئێمەش وەکو ستافی گۆڤاری هونەری نوێ لە هەموو روویەکەوە پشت بە خۆمان دەبەستین و تەنها پێویستیمان بە پشتگیری سەندیکای رۆژنامە نووسانی کوردستانە وەکو رۆژنامەنووسێك تا گۆڤارە کەمان جێگەی خۆی دەگرێت کارئاسانی و رێنماییمان بۆ بکرێت سوپاسیان دەکەین، چونکە بەراستی ئەوان مەرجەعی رۆژنامە نووسانن لە کوردستاندا...

هیوا دارین گۆڤاری هونەری نوێ خزمەتێکی نوێ پێشکەش بکات بە هونەری کوردی و لە هەمانکاتدا رۆژنامەگەری کوردی.

گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیری هونەری رێکلامی گشتی یە ، کۆمپانیای ( هونەری نوێ ) بۆ رێکلام و بلاوکردنەوە دەریدەکات .

بەفرانباری ٢٧٠٩ کوردی ، (سفر)

# رێــــکلام

بۆ بلاوکردنەوەی رێکلامەکانتان پەیوەندی بکەن بە کۆمپانیای هونەری نوێ بۆ رێکلام و بلاوکردنەوە 0750 456 77 49



خاوەنی ئیمتیاز

جەلیل عەزیز ئۆمەر
0750 456 77 49
Jalil.aziz@yahoo.com

سەرنووسەر

سەفەر کەریم هاواری
0750 480 27 71

دیزاینەر

إعلانات شڤان
کۆمپانیای هونەری نوێ

چاپی ژمارە ( سفر )
2010

تیراژ
سێ هەزار دانە

## ئاگاداری

گـۆڤاری ( هـونـەری نوێ ) سەرجەم کۆمپانیا و هوتێل و چێشتـخـانـە و فرۆشـگا و شـوێنە گشـتیەکـان ئـاگـادار دەکـاتەوە , کـە ئـامـادەیە بـۆ بلاوکردنـەوەی رێکـلام بـۆ کـالاو کـەل و پـەل و شـوێنەکانـتان بە نـرخێکی زۆر گـونجـاو بە شێـوازێـکی سـەردەمیـانە , ئـەم گـۆڤـارە ( 3000 ) دانـەی لێ چاپ دەکرێت و بە خـۆرایی دابەش دەکرێت بۆیە ئـەم هەلـە لە دەست خـۆتان مـەدەن و پەیوەندیمان پێوە بکـەن بۆبـلاکردنـەوەی رێکلامەکانتان بۆ زیـاتر ئاشنابون و فـراوان بوونیناوبانگـتان لـە هەموو کـوردستاندا...بۆ زانیاری زیاتر پەیوەندی بە کۆمپانیای (هونەری نوێ ) وە بکەن , ژمارەی مۆبایل ( 0750 456 77 49 )

# باڵی هونەری زمانی جەستە

ئا : گۆڤاری هونەری نوێ

هونەری سەمای بالێ گەرچی مێژوویەکی دێرینی هەیە لە جیهاندا و مێژوەکەی دەگەرێتەوە بۆ سالـی (١٥٧٨) لە وولاَتی ئیتالـیا هاتو تە کایەوە بەلاَم ئێمەوەك میللەتی کورد ئاشنابین لە ساڵی (٢٠٠٨) ەوە توانیومانە بەم هونەرە نوێ یە کە یەکەم گروپی بالێ لە شاری سلێمانیەوە سەری هەڵداو دامەزراوەو لەچەندین ڤیستیڤاڵدا بەشداریان کردووە زۆر جار شارەزایانی بواری ئاوازو موزیك هەوڵیانداوە ئەم هونەرە نوێ یە ئاوێتەی موزیکەی کوردی بکەن بالــێ هونەری زمانی جەستەیە زمانی سەرجەم گەل و نەتەوەکانە زمانێك بۆ هەموو نەتەوەکان زمانێك بۆ خوێندنەوەی سەرجەم کایەکانی ژیان لەسەرووی هەموویانەوە زمانی جەستەو ئاماژەی دیارو نادیارەکان زمانێکە لە مێژە بڕوای بە دانانی سنووری پیت و ووشەو رستەکان و ووتاری چەق بەستووی نی یە بەو هیوایەی ئەم هونەرە زۆر بە گەرمی لە کوردستاندا پێشوازی لێبکرێت هەڵپەرکێ و سەمای کوردیمان بۆ رازەوەتر و دەوڵەمەند تر بکات.









# پێشانگای هەڵمەت




پێشانگای هەڵمەت بۆ فرۆشتنی پیداویستیەکانی

ئاوٚ و ئاوەڕۆ , لە پێشانگای هەڵمەت ئەم

پێداویستیانە دەست دەکەوێت وەك

:شاوەر , بانیۆ , مرافق

غربی , مغسل کەوەنتەر مغسل سادە

سلاید دوش .لە مارکەی ئێرانی و تورکی بە تاکو کۆ

لە پێشانگای هەڵمەت دەست دەکەوێت










ناونیشان : هەولێر شێخەڵا شەقامی 30مەتری - ناو بۆریچیان بەرامبەر کوبەی مام سەلمان

بۆ زانیاری زیاتر پەیوەندی بکەن بەم ژمارانە :-

0750 431 15 15 - 0750 460 86 40 - 0770 152 86 40

بەفرانباری ۲۷۰۹ کوردی , سفر

# هونەرەکانی ئەدەب ..... وتار

ئا : سەفەر کەریم هاواری

یەکەم دەروازە :

بەش و پێکهاتووەکانی هوونەرەکانی ئەدەب زۆرن و زۆر جاریش راو سەرنجیان لەسەر تۆمار کراوە هەر لەسەردەمی فە یلەسوفانی یۆنانیەوە بە شێوازێکی فەرمی قسەو باس رای جیاوازو کتێبی جۆراو جۆر لەسەر هونەرەکانی ئەدەب بلاوکراونەتەوە بەگشتی هونەرەکانی ئەدەب لایەنە بەرزو جوانەکانی ژیانی مرۆڤایەتی لە قاڵب و شێوە جوان و رازاوەدا پیشان دەدەن ئەوەی مەبەستە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین و بەشێوەیەکی گشتی قسەی لەسەر بکەین خوتبەیە.

خوتبە بریتی یە لە هونەری قسەکردن لە پێناوی قایلکردن و کارتێکردندا ئەرستۆ بەم شێوەیە پێناسەی خوتبەی کردووە خوتبە: بریتی یە لە توانین و تەماشاکردنی هەرچی دەستی قایلکردن لە هەرشتێکدا بیگاتێ) خوتبە وەك بەشێکی هونەری پەیوەندی بە جەماوەرو کۆمەڵگاوە هەیە میدیاش رۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە پێش خستنی خوتبە بۆ ئەوەی بتوانێت ئامانجەکەی بریتی یە لە رازی کردنی خەڵك بەتەواوەتی بپێکێ و خوشی بگەیەنێتە دڵ و هۆشو هەستی گوێگران.

بۆیە کەسی ووتاربێژ واتە خەتیب پێویستی بە چەند تایبەتمەندییەکی هۆشەکی هەیە کە بنچینەکەیان لەم چەند خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- بیرکردنەوەیەکی چاك و روونکردنەوەی بەڵگەکانی بۆ ئەوەی شتەکان بسەلمێنێت.

٢- زیرەکیەکی وای هەبێت کەوا کار لەناخی گوێگران بکات.

٣- هەستی ناسك کە زوو کاری تێبکرێ و بۆ جەماوەری باس بکات،( پۆرزا ) دەڵێت: ئەگەر ویستت بمگرییێنی لە پێشدا بۆ خۆت بگری.

٤- رۆشنبیریەکی فراوان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا هەبێ و بەتایبەتی لەولایەنەی کە کردوویەتیە بابەتی خوتبەکە.

٥- راهێنان: بۆ ئەوەی زیاتر کار لە جەماوەر بکات پێویستە خەتیب پراوەی بابەتەکە بکات لە پێناو قایل کردنی جەماوەر.

هاوکات لێرەدا بە پێویستی داەزانین کە ئاماژە بەچەند تایبەتمەندییەکی رەوشتی بدەین کە بنچینەکەیان لەم خاڵانەدا بەدیار دەکەوێت.

- مرۆڤێکی چاك بێت و خاوەن رەوشتێکی بەرزبێت و خێرخواز بێت.
- دەبێت متمانەی تەواوی بەخۆی هەبێت و لەسەر بیروباوەرەکانی سووربێت.

# هونەرەکانی ئەدەب



ئا : سەفەر کەریم هاواری

- هەڵوێستەکانی چەسپاو راشکاوانە بێت بۆئەوەی خەڵکی متمانەی تەواوی پێبکات.

سەرەرای تایبەتمەندیە (هۆشی و رەوشتیەکان) دەبێت لەرووی جەستەو زمانەوە تەواو بێ گیرو گرفت بێت وەك:

١- لە شێکی جوان ، بەژن و بالآی مام ناوەند و رووخوش بێت.

٢- دەنگی ئاشکراو روونی هەبێت.

٣- زمانی پاراوی واتە خەتیب لەکاتی خوتبەدا زمانی پاراو بێت و زمانی تەتەڵە نەکات.

٤- نابێت لە دەربرینی پیتەکاندا هەڵە بکات.



٥- راوەستانی خەتیب لە سەر دوانگەو شێوازی ئاماژەو جوڵەکانی دەست و قاچ و سەروو هەموو ئەندامەکانی لەشی پێویستە لە سنوور دەرنەچن چونکە وەك ئەکتەر وایە هەر نمایشێکی کە لە سنوور دەرچێ دەبێتە هۆی پێکەنینی ئامادەبوان و خەتیبیش تووشی شڵەژان و نیگەرانی دەبێت و ناتوانێ بابەتەکەی بە باشی بگەیەنێت.

* قودامەی کوری جەعفەر دەڵێت (ئەوەی خەتیب جوانتر دەکات و پلەو پایەیەکی لەباری دەداتێ ئاشکرایە دەنگە).

# ئاینی زەردەشت و ژینگە پارێزی

ئامادە کردنی : جلیل عزیز

زۆربەی زۆری ئایین و بیروبارووەڕەکانی ئەم سەر زەمینە باس لە پاك و خاوێنی پاراستنی ژینگە دەکەن چونکە پاراستنی ژینگە بۆ هەموو بوونەوەرێکی سەر زەوی کاریگەری خۆی هەیەو پەیوەستە بە ژیانی هەموو زیندەوەرو رووەکێکەوە زیان گەیاندن بە هەر بەشێکی ئەم گەردوونە لە رووی ژینگە پیس کردنەو رەنگدانەوی خراپی دەبێت بۆ هەموو لایەك چونکە ئەو زەویە وەك کەشتیەك وایە گەر لە هەر لایەکەوە کونی تێبکرێت زیانەکەی بۆ گشت لایەکە ئاین و بیروباوەڕەکان زۆر گرنگیان بەملایەنە داوە هەردەم مرۆڤیان رێنماییی کردووە لە پاراستنی ژینگە کەی بەلاّم ئایینی زەردەشتی کە مێژوویەکی زۆر دێرینی هەیە زۆر زیاتر بۆ ئەم مەسەلەیە رادەوەستێت و لە زۆربەی بەشەکانی ئاڤێستادا جەختی لەسەر دەکاتەوە بەشێوزاێکی پراکتیکیانە رێنمونی مرۆڤایەتی دەکات کە چۆن ژینگەکەی بپارێزێت ئاڤێستادا باس لە چۆنیەتی کشتوکالّ و مردووناشتن و پاك و خاوێنی و نینۆك کردن و سەر تاشین و خۆ شووشتن دەکات لەگەلّ درووستکردنی گەور بۆ ئاژەلاّن و شووشتن و خاوێنکردنەوەی شوێنەکانیان هەموو ڕۆژان گرنگی دان بە کشتوکالّ و دارچاندن بەتایبەتی درەختی بەردار یەکیك بووە لە رێنماییەکانی زەردەشت کە تا ئەمڕۆش کاریگەری هەیە لەسەر ئەوناوچانە کە **بیروباوەڕە** ئایینیەکەی تێدا بلاّو کردۆتەوە ناوچەی هەورامان نموونەو بەلگەیەکی حاشا هەلّنەگرە کە چەند خەلّکی ئەم دەڤەرە دارودرەختیان خۆش دەوێت چۆن گەشتنە هەر شوێنێك و تێیدا مانەوە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت ئەوان خەلاّتی زەوی دەکەن بە چاندنی درەختێك هاوکات ئەمڕۆش کە چۆن لە دەزگاکانی راگەیاندنەوە باس لە ژینگە پارێزی دەکرێت و گرنگی سەوزایی و دارو درەخت بەدیار دەکەوێت سێ هەتا چوار هەزار سالّ پێش ئێستاو بگرە زیاتریش گرنگی بەم بابەتە داوە داوای لە شوێنکەوتوانی کردووە کە دار بچێنن هەرگیز درەخت مەبرنەوە بەتایبەتی درەختی بەرهەمدار لەراستیدا جێگەی سەر سوڕمانە کەلەو سەردەمەو ژینگە پاکەدا داوای زیاتر پاك راگرتنی ژینگەی کردوە هەردەم داوای کردووە کە ئاو پیس نەکرێت سێ شت لای زۆر گرنگ و پیرۆز بوو و هەمیشە داوای کردووە کە لە پیسی بپارێزرێ ئەوانیش ئاگر و ئاو خاك بوون فوویان لە ئاگر نەکردووە باوەڕیان وابووە کە هەلّمی دەمیان ئاگرەکە پیس دەکات زۆر ئاویان لە پیس بوون پاراستووە وە مردوویان بە شێوزای تایبەتی خۆیان ناشتووە چونکە باوەڕیان وایە ئەگەر لەخاکدا بنێژرێت زەویەکە پیس دەکات لە راستیدا زۆرێك لە رێنمایی و بۆچوونەکانی ئەشو زەردەشت سەبارەت بە پاراستنی ژینگە هەتا ئەمڕۆش بە شێوازە ئاساییەکەی خۆی کاریگەری هەیە بۆ سەر پاراستنی ژینگە لەلایەك و یەکگرتنەوەی ئەو بیروبۆچونانە لەگەلّ زانستی سەردەمدا لە بابەت چۆنیەتی پاراستنی ژینگەوە لە لایەکی ترەوە.

# هەورامان

ئا : باوکی لاڤین

ناوچەی هەورامان یەکێکە لەوناوچانەی کە ناوجەرگەی کوردستانی گرتوتەوە بە پێی هەلکەوت و سورشتی توانای پارێزگاری کردنی زۆر شتی هەیە ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێك جێگەی شانازی بێت بۆ هەورامیەکان ئەویش زمانەکەیانە شیاوتر وایە بلێین (شێوازەکەیان) کە لە دێر زەمانەوە هەتا ئەمرۆ ئەم شێوازە و خەسلەت و تایبەتمەندیی خۆیان پارستووە بە داخەوە زۆر لە ئێمە شارەزایی زمانەوانیمان کەمەو ناتوانین لە پۆلێن و چۆنێتی دابەشکردنی زاراوەکانی زمانی کوردی بگەین بەلگەشم بۆ ئەم رایە ئەوەیە کە من بە حوکمی خزمەتکردنی شێوازی هەورامی لە ماوەی دە سالی رابووردودا تا ئەمرۆ گوێم لە نووسین و بۆ چوون و زانیاری نادروست بووە وا دەبینم کە لەناو چینلی رۆشنبیری دا ئەو بۆشاییە هەیەو تاکو ئێستا زۆر خەلك نازانن کە جیاوازی چی یە لە نێوان شێوزای لوڕی و گۆراندا زۆر جار باس لە دیالێکتی گۆران دەکەیت خەلکی وا تێدەگات کە باسی عەشیرەتی گۆران دەکەیت وەك خێلێك سەیری دەکەن نەك وەك دیالێکتێکی سەرەکی زمانی کوردی کە بەراستی ئەمانەش دەگەرێتەوە بۆ کەمی هۆشیاری زمانەوانی لەناو کومەلگەی کوردەواریدا سەرەرای ئەو هەموو پێشکەوتنە بەرچاوەی کە زمانی کوردی بە خۆیەوە بینیویەتی لە بورای راگەیاندندا.

وەك لە سەرتادا ئاماژەمان پێکرد کە هەورامیەکان چەند پارێزگاریان لە خۆیان کردووە بەرامبەر بە دوژمنان دوو هێندە پارێزگاری لە شێوازەکەیان





کردووە قانعی شاعیر لە سەدەکانی پێشوودا ستایشی خەلکی هەورامانی کردووە و دەلێت شاخی هەورامان هەرچەند رەنجەرۆم ، زۆر چاك بزانە کە مەمنونی تۆم چونکە پاراست تۆ ئەو زمانە تێکەلت نەکرد لەگەل بێگانە

ئاشکرایە زمان لە پێش هەموو دیاردەکانی تر لەناو کۆمەلگادا مان و نەمانی نەتەوەکانی لەسەر بەند دەبێت هەربۆیە دوژمنانی کورد لە هەموو شتێك زیاتر پەنایان بۆ لەلناو بردنی زمانی کوردی بردووە بەلام بەدرێژایی مێژوو نەیان توانیوە بۆ ئەم مەبەستە پەی بە هەورامان ببەن کە ئەویش هۆکارێکی تایبەتی خۆی هەبووە ئێستا دەرفەتی باسکردنی نی یە.

# ئاماژەیەك بۆ مێژووی شەترەنج

ئا : گۆڤاری هونەری نوێ

مێژووی شەترەنج تاکو ئێستا بە تەواوەتی روون و ئاشکرا نەبوتەوە بەڵام زۆر بیردووز هەیە کە سەلماندوویانە سەرەتای پەیدابوونی ئەم یارییە دەگەڕێتەوە بۆ هیندیە کۆنەکان واتە لە هیندستانەوە سەری هەڵداوە.

هەر لە بەر ئەوەیە ئەم یاریە بە یارییەکی رۆژهەلاتی ناوبانگی دەرکردووە هیندیە کۆنەکان بەشەترەنجیان ئەووت شاتورانجا واتە شەڕی چوارچەك کە بریتی بوو لە قەلاو ئەسپ و فیل و پیادەکان بەهۆی بارزگانیەوە ئەم یارییە لە هیندستانەوە گوازرایەوە بۆ وولاتی فارس و عەرەبەکان لەسەردەمی ئیسلامدا لەکاتی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتاب وولاتی فارسیان داگیرکردو لەکاتی گەرانەوەیان بۆ حیجاز شەترەنج لە نێو دوورگەی عەرەب بلاو بوّوە.

بەهۆی بازرگانیەوە لە وولاتە عەرەبیەکان گەیشتە ئەندەلوس (ئیسپانیا) وە لەوێشەوە بەرەو وولاتی ئەورویا لە ماوەیەکی کەمدا لە گشت جیهاندا بلاو بوّوە یاری شەترەنج سوودێکی یەکجار زۆری هەیە بۆ وەرزشی مێشك و بیری مرۆڤ مرۆڤ دەباتە ناو جیهانێکی ترەوە یاریکردن بە شێوەیەکی رێك و پێك بەبەردەوامی دەبێتە هۆی زیاد کردنی تەمەنی مرۆڤ هەروەك تەمەنی درێژی فەیلەسوف و پرۆفیسۆرو نووسەرو شاعیروهونەرمەند چونکە یاری شەترەنج پێویستیەکی بە بیرکردنەوەیەکی یەکجار قوڵ هەیە.



سەرچاوە : یاری شەترەنج یاری بەهرەمەندان
(ئارپاك وریا قانع)

# زێـــڕ



لە میسر تەنها خانەوادەی فیرعەونەکان و کاهینەکان بۆ یان هەبووە زێر بەکار بهێنن بۆ خەڵکی تر قەدەغە بووە.

لە دوای ١٠٠٠ ساڵ لە بەکارهێنانی بەردە بەنرخەکان زێر دۆزرایەوە و توانی لە نێوان هەموو جۆرەکانی خشڵ لە بەکارهێنانی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێ. هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندی زێر لە لایەك کەم بوونی ئەم کانزایە لە سروشت لە لایەك و هەروەها جوانی کانزایەکە و بەرگری لە ئۆکسید بوون (ژەنگ) جێگیربوونی لە هەموو باردۆخێکی کەش و هەوادا. هەروەها گۆڕانی بۆ هەموو شێوەیەك.

زێڕ کانزایەکە کە بەرەنگی زەرد دیار دەکەوێت، بەڵام ئەگەر بە جوانی جیا بکرێتەوە دەتوانێت رەنگەکانی رەش سوری تۆخ یان ئەرخەوانی بێت.

زێڕ زیاترین توانایی خوار بونەوەی هەیە دەکرێت یەك ئونسی زێڕ (٣١,١ گرام) بکرێتە وەرەقەیەك کە (٣٠٠ فوت دووجار) بێت. زێر گەیەنەرێکە باشی گەرمی و کارەبایەو ناکەوێتە ژێر کاریگەری هەواو شتەکانی تر هەروەها تواناى بەرگری هەیە لە گەرماو شێ، لەبەر ئەوە بۆ جوانکاری کانزایەکی شیاوە. کانزای زێر زۆر نەرمەو بە ئاسانی خوار دەبێتەوە و لەگەڵ هەندێك کانزای تر تێکەڵ دەکرێت بۆ ئەوەی ئاوێتەیەکی رەقتری لێ دروست ببێت بۆ جوانکاری، بۆ ئەم مەبەستە زیو و سفر cu و پلاتین و ئەوانی تر بەکاردەهێنرێت زیچر دابەش دەکرێت بۆ ٢٤ بەش کە پێی دەوترێت عەیاری ٢٤ کەواتە زێری عەیاری ٢٤ لە ٢٤ بەشی زێرە و عیارەکانی تر بەم شێوەی خوارەوەیە:

| عیار | بەشی زێر | بەشە کانزاکانی تر |
|---|---|---|
| ٢٢ | ٢٢ | ٢ بەشی زێو سفر cu پلاتین |
| ٢١ | ٢١ | ٣ بەشی زێو سفر cu پلاتین |
| ١٨ | ١٨ | ٦ بەشی زێو سفر cu پلاتین |
| ١٤ | ١٤ | ١٠ بەشی زێو سفر cu پلاتین |
| ١٢ | ١٢ | ١٢ بەشی زێو سفر cu پلاتین |
| ٩ | ٩ | ١٥ بەشی زێو سفر cu پلاتین |

# زێڕ

ئا : گۆڤاری هونەری نوێ



پیشەسازی زێر لە مێژوودا بە یەکێك لە کۆنترین پیشەکان دادەنرێت و نیشاندەری داهێنانی مرۆڤە هیندییەکان بۆ یەکەم جار لە کتێبی پیرۆزی خرێیان (٤٠٠٠ ساڵ پێش زایین) ئاماژەیان بە زێڕ کردووە. کۆنترین کانی زێڕ (٤٠٠٠ ساڵ پێش زایین) لە نێوان هەردوو رووبار لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بووە و دەگەڕێتەوە بۆ سۆمەرییەکان لێکۆڵینەوەکانی مێژوویی ئەوە دەردەخات کە لە نێوان ساڵەکانی ٢٦٥٤ تا ٢٦٨٥ پێش زایین لە ئابیدۆس (abydos) و نگدە(nagada) لە میسر زێڕنگری رەواجی هەبووە. ئەم رێکەوتە دەگەڕێتەوە بۆ پێش بەکارهێنانی زیو.





بەرێوەبەرایەتی کۆنترۆڵی جۆری خشڵ لەسەرەتا وەکو هۆبەیەك لەدەستەی ئاماری هەرێم دامەزراوە بۆ کۆنترۆڵ کردنی کاروباری زێڕینگری لە ساڵی ٢٠٠٣ بووە بە بەرێوەبەرایەتی کۆنترۆڵی جۆر و لە ساڵی ٢٠٠٧ مانگی کانونی دووەم بە فەرمانی وەزاری گواسترایەوە سەر دەستەی گشتی پێوانە سازی و کۆنترۆڵی جۆر لە وەزارەتی پلان دانان.

*ئەوەی شایەنی باسە یاسای خشڵ و زێر لە عێراقدا بە ژمارە (٨٣) ساڵی ١٩٧٩ [illegible] ائیێ پێدەکرێت.

# ((( جەژنی لە دایك بوون )))

سامی رەفعەت






دەی بە چە پڵەو گۆرانی
تێکرا بە شادوومانی
ئاهەنگی خنجیلانە
بۆ ئەم پە پولە جوانە
لەم یادەدا پێشکەش کەین
داخوازی رۆژی گەش کەین
بۆ ئەم و گشت مندالێ
لە هەموو لادێ و شارێ
هەموو بلێین بە جارێ
ئەی گولێ خونچەی بەهارێ
وا گزنگی سالێ نوێ
لە باخچەی عومرت هەلدێ
هەزار جار لێت پیرۆز بێ
ژینت پڕ خەندەو سۆز بێ

پێی دەوترێت
٢٤ بەشی زێڕە و عیارەکانی تر